# چۆن لە ڕۆژوو و
# ڕەمەزان تێبگەین؟



# چۆن لە ڕۆژوو و ڕەمەزان ئێبگەین؟



باوکی عبداللە



١٤٤٤ ﻫ

قالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰه عليهِ وَسلّم

# من صام رمضان

# إيماناً واحتساباً غفر

# له ما تقدم من ذنبه

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمدالله رب العالمين والصلاة والسلام على عبده ورسوله، وعلى آله وأصحابه، ومن صار على نهجه وهديه إلى يوم الدين.

وأما بعد.....

اللهم بلغنا رمضان ئيماناً واحتساباً، ربنا آتنا في الدنيا حسنةً وفي الآخرة حسنةً وقنا عذاب النار. لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين. اللهم ارحم قسوة قلبي وقسوة عيوني. اللهم إني أسألك علما نافعا. وأعوذ بك من علم لا ينفع. اللهم أحسن عاقبتنا في الأمور كلها، وأجرنا من خزي الدنيا وعذاب الآخرة. اللهم اقسم لنا من خشيتك ما تحول به بيننا وبين معاصيتك، ومن طاعتك ما تبلغنا به جنتك، ومن اليقين ما تهون به علينا مصائب الدنيا، اللهم متعنا بأسماعنا، وأبصارنا، وقواتنا ما أحييتنا. اللهم لا تجعل الدنيا أكبر همنا، ولا مبلغ علمنا، ولا إلى النار مصيرنا، وأجعل الجنة هي دارنا وقرارنا. **اللهم آمين**.

**باوكی عبدالله**



## چۆن لە ڕۆژوو و ڕەمەزان تێبگەین؟

سوپاس بۆ رب العالمین نزیکی کردینەوە لە مانگی ڕەحمەت و هیدایەت، مانگی گەڕانەوەی گوناهباران و کەمتەر خەمەکان، مانگی شەحن بوونەوە و زاڵبوون بەسەر ئارەزوو و شەهەواتەکاندا، مانگی تازەکردنەوەی ئیمان و ئەقڵ و فیکر و هۆش و دڵ و لاشە و ناو ماڵەکانمان، مانگی بەرزبوونەوەی غیرەت بۆ بانگەواز و فتووحاتی ئیسلامی و زیندووکرنەوەی جەنگی بەدر.

لە ڕەمەزاندا پێویستە هەموو موسڵمانێك بە گشتی و بانگخواز و تیکۆشەر و هەڵگرانی (لا اله الا اللّٰه) شوێنکەوتوانی ئەهلی سونەت و جەماعەت و سەلەفی صالح بەتایبەت بزانن مانگی ڕەمەزان خۆ ئامادەکردنە بۆ جیهادێکی زۆر گەورە، بۆ جیهادێك کە فەرزی عەینە بۆ جیهادێك کەجیهادی هەموو ئوممەتانی پێش ئیمەیە،




ئامادەکرنی کۆمەڵێك کادیری ئیسلامی بۆ هەشتی فیردەوسی لە ماوەی سی ٣٠ ڕۆژدا! درووستکردنی جەیشێکی بەدری، وە جەیشێکی فەتحی مەککەیی، ئامادەکرنی جەیشێك ( لایحبون إلا لقاء الله ﷻ ) جەیشێك کەوا هەموو هەست و هۆشیان لەسەر ئەوەیە چۆن بگەن بە الله ﷻ! جەیشێك کەوا زاڵبن بەسەر شەهەواتی دونیا، بەسەر شەهەواتی حەرام، وە سنووردارکردنی شەهەواتی حەڵاڵ، جەیشێك کە درووشمیان ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ (سُورَةُ البَقَرَةِ)، درووشمیان ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٤٧ ﴾ (سُورَةُ الشُّعَرَاءِ)، درووشمیان ئەوەیە کە بەتاغوتەکان دەڵێن:

﴿ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ ﴾ (سُورَةُ طه).

واتا: سا تۆ هەر بڕیارێ دەدەیت بەرامبەرمان بیدە، یا هەرچیت لەدەستدێ درێغی مەکە.



چیت لە دەست دێت ؟ من بکوژی ؟ لە ژن و منداڵم دوورئەخەی؟ لە شـــارەکەم دەرم دەکەیت؟! هەرچیت لـەدەسـت دێ بـیـکە ﴿مَآ أَنتَ قَاضٍۖ﴾ جـەیـشـێـك پەروەردە بێت لەسەر دڵی ابن تیمیە رَحِمَهُ اللَّهُ کە دەیفەرموو: دوژمن چی لە من ئەکات؟ ئەمکوژن شـــەهیدبوونە لە پێنـاوی اللّٰه جَلَّ وَعَلَا، دەرم ئەکەن گەشـــت و ســـەیرانە، وە ئەیشمگرن دڵم فراوان ئەکات و خەڵوەتێکە.

ڕەمەزان لە بنچینەدا ئەوە مـانـاکـەیەتی، بەڵام مانا کورتەکەی لای خەڵکی دونیا ئەهلی شەهەواتی (سك) کە واتیگەیشـــتوونە لەم مانگە ئەبێ بۆ ســـك بەڕۆژوو بیـت نەک بۆ بەدەســـت هێنـانی ڕەزامەنـدی اللّٰه جَلَّ وَعَلَا، بەڵکو ئەبێت چەند سەعاتیك برسی بێ تاوەکوو بگەیتە ئەم پلە گەورەیە.




الله ﷻ لەم ســـی ڕۆژە جەیشـــێکی وای ئەوێ کە ســـەراتاکەی ئیمانە و کۆتاییەکەی تەقوایە، جەیشـــێک کەوا پارێزراوە بەســـەرەتای ئیمان وە پارێزراوە بە کۆتایی تەقوا.

وەک الله ﷻ دەفەرمووێــت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَـــا ٱلَّـــذِينَ ءَامَنُـــواْ كُتِـــبَ عَلَـيۡـكُمُ ٱلصِّــيَامُ كَمَـا كُتِـبَ عَلَى ٱلَّـذِينَ مِـن قَـبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُـمۡ تَتَّقُـونَ ١٨٣﴾ (سُـــورَةُ البَقَرَةِ).

واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بزانن رۆژووی مانگی رەمەزانتان لەســـەر نووسراوە و فەرز کراوە، هەر وەکو لەســـەر ئەوانەی لە پێشـــتـانەوە بوون بڕیـاردراو نووسرا، (دیـارە هەر هۆزو ئوممەتێـک، جۆرێ ڕۆژووی بووە)، بەڵکو بە تەقوا بن و، سنوورەکانی خوا بپارێزن و






دەرگای گوناح لەخۆتان داخەن و دەرگای هەموو خێرێ لەخۆتان بکەنەوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کۆمەڵەی ئیمانداران با سەرەتای جەیشەکە بە ئیمان بێت، با قائید و عولەمایەکانتان ئیماندار بن، با چەکی دەستتان ئیمان بێت،

یەکەم نیشانەی هیدایەتی اللّٰه ﷻ لە هیدایەتە هەرە گەورەکان لە بچووکیەوە لەسەر ئیمان پەروەردەی دەکات.

ڕەمەزان دەورەیەکی گەورەی (٣٠) سی ڕۆژییە پەروەردە بوونی عبداللّٰه ی کوڕی ڕەواحەیە، پەروەردە بوونی عبداللّٰه ی کوڕی زوبەیرە، پەروەردە بوونی صلاحەدینی ئەیوبیە، پەروەردە بوونی تاریقی کوری زیاد و موسای کوڕی نوسەیرە، ڕەمەزان ئەو مانگەیە کەوا






اللّٰه ﷻ کردوویەتی بە ڕووکنێـك لە ڕوکنەکـانی ئەم ئیسلامە، کە هەرکەسێك بەبێ ئەم ئیسلامە بگەڕێتەوە بۆ لای اللّٰه ﷻ بۆ هەتا هەتایی لە دۆزەخە.

وەک اللّٰه ﷻ دەفەرمووێــت: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾ (سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ).

واتا: هەرکەسـێ بێجگە لە بەرنامە و شـەریعەتی ئیسـلام هەردینێـک بۆ خۆی هەڵبژێرێ و بیکـات بە بەرنامەی خۆی هەرگیز لێیوەرناگیردرێ، و لەدوارۆژیـشدا لەڕیزی زیانمەندانە.

ڕۆژوو ڕوکنێکە لە ڕوکنەکـانی ئەم دینە ، ئەکرێ ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی ئیسـلام بەس لەبەر ئەوە بێت کە (سـك) برسـی بێت؟! ئەمە تێگەیشـتنی هەرە گەورەی






قـودوەی جـاهـیـلەکـانە نەک هەر جـاهـیـلەکـان! بەڵام ئەوانەی کە اللّٰە ﷻ هیدایەتی داون ئەزانن دەورەیەکی زۆر پیرۆزیان لە پێشە، ئەزانن دەورەیەك ئەوەندە بەهێزە چۆن یوسف عليه السلام هێزی ئیمانەکەی زاڵ بوو بەسەر پۆخڵەواتی یـانزە براکەی، ئەم مـانگەیش ئەفەرمووی: هێزی من ئەوەیە ئەگەر تۆ بەڕاستی و درووستی پەروەردەبیت گرینتیت ئەدەمێ لەو یانزە مانگەی دوای خۆم نە نەزەر ئەکەی ! نە گوێ لە گۆرانی و مۆسیقا ئەگری!! نە شوینی دینار و درهەم ئەکەوی!! نە لە عیبادەتیشدا سارد ئەبیتەوە !!!! .

من ئەو مـانگەم یوسف ئـاسا چۆن یوسف عليه السلام سـەرکەوت بەسـەر قۆناغەکانی ژیانیدا لە پارە لە ئافرەت لە ناو ماڵ و قەسرێکی خۆش بە دوورکەوتنەوە بە هەموو بەشـەکـانیەوە، منیش ئەو مـانگەم کەوا ئەتوانم ئەگەر ڕاستگۆ بی لەگەڵمدا ، من یانزە مانگەکەی






تر ئەتپاریزم، ئەتپاریزم لە بیرەکەی یوسف، ئەتپاریزم لە زولەیخا کان، ئەتپاریزم ئەگەر بەیانی ئابووری شارێك بکەوێتە بەردەستی تۆ، ئەتپاریزم ئەگەر لە زیندانیش بی.

ڕۆژوو قەڵایە، ڕۆژوو قەڵغانە پارێزەرە، بەم شێوە ئەهلی ئیمان ئەهلی دوعا ئەهلی جیهاد تەدەبوور لە کەلامی اللّٰه جل وعلا دەکەن، ئەزانن کەوا دەورەیەکی تایبەتە، ئەم دەورەیە اللّٰه جل وعلا کردیتیەوە، کوانێ تۆ بڵێت شێخ فڵان قائد فڵان! ئەمە خیبرەی (٣٠) سی ساڵی هەیە لە سەحەکە، کوانێ کەسێك داخلی دەورەیەکت بکات کەوا (علم المطلق )ی لایە کەوا عیلمەکەی سەرەتای نیە تاوەک کۆتایی هەبێ!!!!.

اللّٰه جل وعلا دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَـٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَـٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ١٠٩﴾ (سُورَةُ الكَهْفِ).






واتا: پێیان بڵێ: ئەگەر بۆ نووسینی وشەکانی پەروەردگارم دەریا گشت مەرەکەب بێ تاحیکمەت و نهێنیەکانی ئەویان پێ بنووسرێ، پێش کۆتایی هێنانی وتەو بڕیارەکانی پەروەردگارم دەریا هەموو هەڵدەچۆڕێ، ئەگەرچی ئەوەندەی تریشیان فریاخەین بۆ کۆمەکییان، هێشتا هەر کۆتاییان نایەت.

ئەمە دەورەیەکە العلیم کردیتێەوە دەورەیەکە زاتێك کردیتێەوە وەصفی خۆی ئەکا ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ (سُورَةُ الأَعْرَافِ) مـن دروو ستم کردووی منیش ئەزانم چ دەورەیەك بۆ تۆ باشە، شەیتانەکانی ئینس و جن و تەواغیتەکان هاوەڵەکانیان نەتوانن لێت نزیك ببنەوە ، من داخیلی دەورەیەکت دەکەم دەوری خۆت بگری، ئیتر کوفر و شیرك و ریددە و سارد بوونەوە نەتوانن نزیکی تۆ بکەونەوە!!، ئەمە پێی ئەوتری دەورەیەکی ئیلاهی ، ئەمە پێی ئەوتری ڕەمەزان لەسەر






شێوەی یوسف عليه السلام ! ڕەمەزان پێت ئەڵێ کێشە نیە تۆ لە ناو بیری، کێشە نیە تۆ لە زیندانی ، کێشە نیە زولەیخاکان بانگت بکەن، گرینگە تۆ دڵی خۆت بدەیتە ئەو زاتەی کە درووستی کردووی،گرینگە تۆ سەرەتای دڵت بە ئیمان بێ و کۆتاییەکەی بە تەقوا بێ ،ئەوکاتە تۆ سەرکەوتوو دەبی لە جیهادەکەتدا. ئەوکاتە تۆ موجاهیدێک ئەبی بە کوشتنی هەزاران نەفەر!. ئەوکاتە شەیتان لەژێر سێبەری تۆ ڕائەکات!، ئیتر ڕۆژی ئەوە دێ کە خەڵك لە تۆ سارد بکاتەوە نەك تۆ سارد بکاتەوە ، چونکە عەبد دەگاتە قۆناغێك شەیتان لێی دوور دەکەوێتەوە، خەریکی ئەو کەسانە دەبێت تا ساردی بکاتەوە چونکە ئەزانی ئەوەی لە تۆ نزیك بێتەوە لە اللّٰه جل وعلا نزیك ئەبێتەوە!، ئەگەرچی ئەزانی ئەوان لاوازن زەفەر بەوان ئەبات، وەکوو ئەوە بەسەر زۆر برای دڵسۆز دێت بەڵام هەستی پێناکەن لەبەر ئەوەی نەگەیشتونەتە



قۆناغی تێگەیشتنی گەورە !!!. هەتاوەکوو اللّٰە جل وعلا هیدایەتی ئەدات بگاتە قۆناغیکی گەورە ئەو کات ئەزانی بۆ شەیتان لە هەندێك شت ساردی ئەکاتەوە بۆ لە هەندێك شت دووری ئەخاتەوە، ئەوکاتە تێدەگات ئەگەر اللّٰە جل وعلا زیاتر هیدایەتی بدات.

بۆیە ئەم دەورەیە گەورەیە ئەبێ گەورەکان بەژداری بکەن، بچووکەکان تیا ئەدۆڕێن! بچووکەکان هەر لە ڕەوزەن ، دیراسەی چەند ساڵی ئەم گەنجانە ئەم بچووکانە بکە لەو دەورەیە هیچیان نەهاتۆتە قۆناغی دووەم، هەمووی هەر لە قۆناغی سەرەتاکەی ماوەتەوە، اللّٰە جل وعلا ئەفەرمووی: منەتم بەوە نیە تۆ سکی خۆت بۆ من برسی بکەی، من ئەو ئامانجەی کە دامناوە لەو دەورەیە ئەبێ ئەوە جێبەجی بێ ،ئەویش لەبەر خودی خۆی نیە، لەبەر ئەوەیە کە هەرچی من ئامادەم کردووە بۆ عەبدەکانم لەدوای ئیمان و تەقوا




بەدەســتی ئەکەوێت، وە هەرچی شــەڕێکە دامناوە بە دووری لە ئیمان و تەقوا عەبدەکانم تووشی ئەبێت.

کاتیك کە تۆ بە ڕۆژوو ئەبیت دەرگا لە شــەیتان دا ئەخەیـت، شــەیتـانەکـان ئینســـان دوور ئەخـاتەوە لە ڕەحمەتی اللّٰه ﷻ. وە کـاتیـك تۆ بەڕۆژوو نـابی دەرگـای شــەیتان دەکرێتەوە و دەرگای شــەهەوات ئەکرێتەوە (وحفت النار بالشهوات).

کەواتە تۆ قســە و کردەوە و داوینت و ســکت و چاوت هەمووی دەبێتە جەهەنەمی ، چاو نەزەر ئەکات دڵ شــەهەواتی دەوێ ســك شــەهەواتی دەوێ فەرج شــەهەواتـی دەوێ ، چـونـکە تـۆ داخـلـی دەورەیەکـی جەهەنەمی بوویت، کاتیك کە تۆ تەدەبوور دەکەیت لە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ وەکــوو لە پــێــشــدا ووتومانە (لکل یوم آیة) باسمان کردووە (لماذا بدء العلیم الحکیم الخبیر هـذه العبـادة بـالإیمـان ) لەبەر چی اللّٰە بە ئیمان






دەستی پێکردووە ؟ هەموو ئەم دینە کەسانێك ئەتوانن جێبەجێی بکەن و بڵاوی بکەنەوە و سـەری بخەن کەوا ئـیمان لە دڵـیانە نەك ئـیمان لە نـاو کەنـاڵەکەی و لە دانیشــتنەکەی و لە گوێگرتنی و لە خزمەت کردنی بانگەوازەکەی، ئەمە ظاهیریە ئێمە ئەبێ سـەیری دڵمان بکەین دڵم چەنێـك لەگەڵ ئیمانە؟ چەنێـك ئیمان لە دڵمە؟چەنێـك دڵم ئـامـادەی قوربـانیە بۆ خـاوەنی ئەو ئیمانە.

اللّٰه ﷻ دەفەرمــووێت:﴿ قُـــلۡ إِنَّ صَـــلَاتِي وَنُسُـــكِي وَمَحۡيَـــايَ وَمَمَـــاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِـــينَ ١٦٢﴾ (سُورَةُ الأَنْعَامِ).

واتا: بڵێ: بە ڕاستی نوێژ و حەج و قوربانیی و ژیان و مردنم، گشت هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە .






ئەی پەروەردگـارم من تەنهـا نوێژێـك نیە لە مـاڵ بیکەم و ڕۆژوویـك نیە لە مـاڵ بیگرم ، ژیـانم كڕینم فرۆشــتنم خیزانم منـداڵم ســەیـارەكەم شــارەكەم شەهادەكەم جوانیەكەم هەمووی بۆ تۆیە هەمووشی دەبێت لە پێناوی تۆ لە پێناوی دینەكەی تۆ بێت.

﴿ وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي ﴾ ئەوە كە سێك ئەتوانی بیكات داخلی ئەو دەورەیە بێ، ئەم دەورەیە دەورەی زاهیدینە ، ئەم دەورەیە فێرت ئەكـا كەوا ژیـانی دونیـا ڕاســتێكەی چۆنە . ئیتر دوای ئەم سی (٣٠) ڕۆژە سفرەكەی لا ئەدەی ســێ تەڵاق دەمینێتەوە تەســلیمی دونیـا و ئەهلی دونیای ئەكەی!!! واتا تۆ بەیەك سفر دەربازت ئەبێ، سی (٣٠) ڕۆژ دەورە بۆ ســێ تەڵاقی دونیـا ، تۆ ئەزانی دونیـا یـانی چی ، تۆ ئەزانی ڕاســتی دونیـا چیە ئەوكـاتە، لەبەر ئەوە گرینگە ئێمەی ئەهلی ئیمان بەم شــێوە لە ڕۆژوو تێبگەین و بزانین ئەمە دەورەیەكە زۆر لەوە گەورەترە كە






من چاوەڕێ بکەم لە ڕەمەزان پۆستێك بڵاوبکەمەوە!! یا محازەرەیەك بدەم، ڕوكنێك لە ڕوكنەكانی ئیسلام تەنها بۆ پۆستێكە ؟؟! لەهەمان كاتدا ئەمە عیبادەتێكی گەورەیە، مانگی بانگەوازە مانگی ئەوەی خەڵك دڵی نەرم بێ بەرەو ئیسلام بێت.

بەڵام كادیری ئیسلامی ئەزانێت كەوا ئەم مانگە ئەبێت ئەوەندە تیا سەركەوتوو بی كە جیهادی یانزە مانگەكەی تری پی بكرێت.

داوا ئەكەین لە اللّٰه ﷻ لەسەر خیر بۆ خیر (ئماناً واحتساباً ) بەو تێگەیشتنە بمانگەینی بە مانگی ڕەمەزان.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه وسلم





يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ
كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ
مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ